16

زنجیرەی گەنجانی ئیسلامی






# پوختەیەك دەربارەی
# پێنج پایەكەی ئیسلام



نوسینی : ئوسامە كوردی





بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحمدَللَّه، نحمدُه ونستعينُه، ونستغفرُه، ونتوبُ إليه، ونعوذُ به من شرورِ أنفسِنا؛ ومن سيِّئاتِ أعمالِنا، من يهدِه اللَّه فلا مُضِلَّ له، ومن يضلل فلا هاديَ له. وأشهد أنْ لا إلهَ إلا اللَّه وحدَه لا شريكَ له، وأشهدُ أن محمداً عبدُه ورسولُه، صلَّى اللَّه عليه، وعلى آلهِ وصحبِهِ، وسلَّمَ تسليماً كثيراً إلى يومِ الدين.

وبعد__:

خوێنەرانی بەڕێز بە پشتیوانی خوای پەروەردگار لەم نامیلکە بچوکە دا باسی پێنج بنچینەی ئیسلام دەکەین هیوادارین ببێتە جێگەی ڕەزامەندی خوای پەروەدگارو ئەم کارەمان لێ قبوڵ بکات، و ئێوەی بەڕێزیش سوودی لێ ببینن.

ثبت في الحديث الصحيح أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: افترقت اليهود على إحدى وسبعين فرقة، وافترقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة، وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، قيل: من هي يا رسول الله؟ قال: من كان على مثل ما أنا عليه وأصحابي. وفي بعض الروايات: هي الجماعة). رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه والحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم.

واته: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (یەهودیەکان دابەش بوون بۆ حەفتاو یەک فرقە، وە نەصاراکان دابەش بوون بۆ حەفتا و دوو فرقە، وە ئوممەتەکەی من دابەش دەبێ بۆ حەفتا و سێ فرقە، کە هەموویان دەچنە دۆزەخ تەنها یەک فرقەیان نەبێ) وتیان ئەو فرقەی دەربازی دەبێ کامەیە؟؟ وتی (ئەوەی لەسەر ئەو باوەڕەن کە من و هاوەڵانم لەسەری بوون)

بیروباوەڕ، بە عەرەبی (العقیدە) لە چاوگی (عَقد)ەوە وەرگیراوە، کە لە زمانی عەرەبی بە واتای گرێدان و بەستن دێت، لەمەوە هەرشتێک لە بیروڕاوبۆچوونەکان کە دڵی مرۆڤی لەسەر ببەسترێت بەجۆرێک پەسندی کات و ئارامی بۆی هەبێت ئەوترێت عەقیدە، جا ئەم بیروبۆچوونانە ڕاست بن یان هەڵە، جیاوازی ناکات.

پێناسەی بیروباوەڕی ئیسلامی: بریتییە لە باوەڕی دامەزراو بە پەروەردگاریێتی و پەرستراوێتی و حاکمیەت و ناوو سیفەتە بەرزەکانی پەروەردیگار وە بە فریشتەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و قەزا و قەدەر و خێر و شەڕەکەی وە بە پەرتووکە ئاسمانی یەکان و گشت (غەیب) و نادیارەکان وە باوەڕ بە بنەڕەتە سەرەکی یەکانی دین و هەموو ئەوانەی کە پێشینە چاکەکانمان لەسەری هاوڕان وە مل کەچ کردنی تەواو بۆ خودای گەورە لە (حکم) بەڕێوەبردن و گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی پێغەمبەر (علیه الصلاه و السلام).

بەڵام لە زاراوەدا عەقیدە بریتیە لە بڕواهێنانێکی تەواو بە بابەتە غەیبیەکان، کە باسەکانیان لە ڕێگای قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە ڕێ پێ بردنی پێشینەکانی ئەم نەتەوەیە بەدەست گەیشتون، وەک بڕواهێنان بە خوای تاک و تەنها و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاوقەدەر، هەروەها بڕواهێنان بە هەموو بابەتەکانی تری پەیوەست بەمانەوە، وەک؛ باسەکانی پەیوەست بە ژیانی ناوگۆر، کە لە ڕواڵەتا بۆ مرۆڤ وون و نادیارن.

پێناسەی بیروباوەر(العقیدة)كە بریتییە لە زانیاری بە حوكمە شەرعییە گرێدراوەكان لە دڵدا كە وەرگیراون لە قورئان و فەرمودە صحیحەكانی پەیامبەری خوا صلى الله علیه وسلم بە تێگەیشتنی صەحابە و تابعین و سەلفی صالح.

وەک باوەربون بەخوا وفریشتەكانی و كتێبەكانی و پەیامبەرانی و بەرۆژی دوایی و بە قەدەر و خێر و شەری، هەروەها باوەربون بە هەموو بوارەكانی غەیب و رەتكردنەوە و بەرپەرچدانەوەی بیدعە و گومانەكانی عەلمانی مولحید و گاورەكان و بیروباوەرە پوچەكان. كەواتە بیروباوەر لای ئەهلی سوننە بەو زانیارییە ڕاستانە دەوترێت كە لە دڵدا جێگیربون و دڵی لەسەر گرێدراوە و قەبوڵی گومان ناكەن.

سەرەتا شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە لە سەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵەکانی شتێک نەبووە کە پێی بوترێت (زانستی عەقیدە) هەروەک زانستە شەرعیەکانی تر، بەڵکو هاوەڵەکانی پێغەمبەر ئەوەی لەم زانستانەوە مەبەست بووە ڕاستەوخۆ لە قورئان و سوننەتەوە وەریان ئەگرت و لێی تێ ئەگەیشتن، بەڵام دوا بەدوای سەردەمی ئەوان و لەبەر چەند هۆکارێکی تری وەک فراوانبوونی قەوارەی جیهانی ئیسلام، بە تایبەتی بە موسوڵمان بوونی گەلانێکی زۆر، بۆ ڕێگرتن لە دروستبوونی جیاوازی و ناکۆکی لەسەر بیروباوەڕە بنچینەییەکان، زانایان هەستان بە ڕووبەڕووبوونەوەیان و لە ئەنجامدا ئەم زانستە شەرعیانە هاتنە کایەوە.

## سەرچاوەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی:

عەقیدە (بیروباوەڕ) لە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت تەنها دوو سەرچاوەی سەرەکی هەیە؛ قورئانی پیرۆز کە تاکە سەرچاوە و مەنهەجی هەموو موسولمانێکە لە هەموو کاتێک و هەموو شوێنێک. سوونەت؛ مەبەست لەمە فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەری ئازیز صلى الله عليه وسلم ئەکات. هەروەها هەندێک جار ئیجماع واتە (کۆبوونەوەی ڕای هەموو) ئوومەتی ئەخرێتە پاڵیانەوە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە قورئان و فەرمودەکان.

کەواتە تەنها سەرچاوەی وەرگرتنی بیروباوەر بریتییە لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمودە (حدیثە) شیرینەکانی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە تێگەیشتنی صەحابە و تابعین و سەلەفی صالح و پێشەوایانی ئوممەت، ئەمە سەرچاوەی وەرگرتنی بیروباوەڕی ڕاست و ڕەسەنی ئیسلامە، جا هەر کەسێک لەهەر کات و شوێنێک بێت و بیروباوەڕی لەم سەرچاوەیەوە وەرنەگرێت ئەوا دوچاری (انحراف) لادان و (ضلال) گومرابون و (هلاک)تیاچون دەبێت،پەنا بەخوا، چونکە بیروباوەڕی یەکخواپەرستی دوور لە گومڕایی بنچینەی بەختەوەری مرۆڤە لە دونیا و ڕۆژی دوایدا..

## پێناسەی ئیسلام

الاسلام هو: الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة و براءة من الشرك و اهله.

پێناسەی ئیسلام: تەسلیم بوون بۆ پەروەردیگار بە (تەوحید) یەک خوا پەرستی، وە ملکەچی بۆی بەگوێڕایەڵی، وەخۆبەری کردن لە هاوبەش دانان و هاوبەشدانەران.

ئیسلام بریتیە لەخۆ بەدەستەوەدان و ملکەچ بوون بۆ خوای گەورە بەئەنجامدانی عیبادەتکردن تەنها بۆ خوای گەورە، وە پابەندبوون و پەیوەست بوون پێیەوە بەگوێڕایەڵیکردنی، وە دووره پەرێزی و خۆ دوورخستنەوە لەو کەسانەی کە پیشەیان هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوای گەورە (واتا: مشرکین).

## پایەکانی ئیسلام

ئیسلام لەسەر ئەم پێنج پایەیە بونیاد نراوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئاماژەی پێ داوە: (بني الإسلام على خمس شهادة أن لا إله إلا الله ، وأن محمداً رسول الله و إقام الصلاة ، وإيتاء الزكاة والحج وصوم رمضان) متفق عليه أخرجه البخاري برقم ٨

واتە: ئیسلام بونیاد نراوە لەسەر پێنج بنچینە: شایەتی دان بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە شایستەی پەرستن بێ بە حەق جگە لە الله ،و موحەمەد نێردراوی خودایە و نوێژ بکات و ڕۆژو بگرێت و زەکات بدات و حەج بکات.

ئیسلام بیرو باوەڕ وشەریعەت و حوکم کردنە، خودا پاشان پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم هەموویان ڕوون کردۆتەوە چ شتێک حەڵاڵە و کامە حەڕامە و ئادابەکان چین و عیبادەت و کڕین و فرۆشتن چۆن دەکرێت، وە پەیوەندی نێوان بەندە لەگەڵ پەروەردگاری، وە بەندە لەگەڵ بەندە، وە بەندە لەگەڵ دوژمنانێ ڕوون کردۆتەوە، و حاڵی خەڵکی لە دونیا و ڕۆژی دوایی ڕوون کردۆتەوە، خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم ئەو دینەی تەواو کردووە کە خۆی لێی ڕازیە بەڵکو ببێتە ڕێبازی ژیان تاوەکو ڕۆژی دوایی،

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا ) المائدة/٣ .

واتە: ئەمڕۆ دینەکەی خۆم بۆتان تەواو کرد، هەرگیز پێویستتان بە زیادە نابێت بیهێننە ناو دینەکەتانەوە، وە ئاشکرام کرد بەسەر هەموو دینەکاندا ، وە نیعمەتی خۆم تەواو ڕژاند بەسەرتاندا بەوەی کە مەککەم بۆ ئازاد کردن و بەسەر کافراندا زاڵم کردن، وە ڕازی بووم کە ئیسلام دینی ئێوە بێ تا ڕۆژی قیامەت، وە ئێوەیش رازی بن کە دینتان بێت.

پایەی یەکەم شایەتوومان هێنان.

لا اله الا الله و محمد رسول الله

ئەو الله یە کە پەروەردگاری ئێوەیە ، هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە شایەنی پەرستن بێ تەنها زاتی پیرۆزی الله نەبێ.

کە دروستکاری هەموو شتێکە، ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەت بۆ ئەو خوایە بکەن چونکە تەنها ئەو شایەنی پەرستنە وە هەر ئەو تواناو دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە وە پارێزەری هەموو شتێکە.

وە باوەڕی وابێت خوای گەورە بە تەنها دروستکار و ڕازقە و هەر ئەو ئەم بوونەوەرە بەڕێوە دەبات،

هەروەک خـوای پەروەردگـار فەرمـوویەتی: (بـديع السماوات والأرض أنى يكون له ولد ولم تكن له صاحبة وخلق كل شيء وهـو بـكل شيء عليم ، ذلكم الله ربكم لا إله إلا الله هـو خـالق كل شيء فاعبـدوه وهـو على كل شيء وكيل) الأنعام/١٠١-١٠٢.

واته: خوای گەورە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییەو دروستی کردوون بە شێوازێك کە پێشتر وانەبوونە، خوای گـەورە چۆن منـاڵی ئـەبێت لە کاتێك کـە خێزانی نیـە ئەمـە شـتێکی ئەسـتەمە، وە خـوای گـەورە هەموو شتێکی دروست کردووە بە مەلائیکـەت و عیسی- و عـوزێرو هەموو ئەو کەس و شتانەی تر کە ئەوان ئەیدەنە پاڵ خـوای گـەورە هـەمووی عەبـدو دروسـتکراوی خـوای گـەورەن، وە خـوای گـەورە زانیاری بەهەموو شتێك هەیە.

هەروەها باوەڕی وابێت کە خـودا پێغەمبەرەکەی مـوحەمەدی صلى الله عليه وسلم ناردووە وکتابێکی لەگەڵدا دابەزاندە وە باوەڕی وابێت کە کارکردن و حـوکم کردن بەم کتـابە واجـبە، وە هەرکەسـێک نابێـتە موسوڵمان تاوەکو باوەڕی تەواوی بەوە نەبێ کە کارکردن و حـوکم کردن بەقورئـان و سـونە واجبێکـی حەتمـیە، وەهەروەهـا باوەڕی وا بێـت خۆشەویستی خودای تعالى پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و گوێڕایەڵی کردنیان واجبە لەسەر هەموو تاکێک وخۆشەویسـتی خـودا

نايەتە جێ تەنها بەشـوێنكەوتنى پێغەمبەرەكەى صلى الله عليه وسلم نەبێت: (قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم والله غفور رحيم) آل عمران /٣١. واتە: ئـەى پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم پێیان بفەرمە: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن خواى گەورەتان خـۆش ئەوێ ئەوە شوێن من بكەون ئەوە ئەو كاتەش خـواى گـەورە ئێـوەى خـۆش ئـەوێ وە لە تاوانـەكانتان خـۆش ئـەبێ، كەسـانێك بانگەشـەى خۆشەویسـتى خـوایان كرد خـواى گـەورە بـەم ئايەتـە تاقیكردنـەوە، كەواتــە هەركەســێك شــوێن پێغەمبــەرى خــوا صــلى الله عليــه وسلم نەكەوێت و بیدعە بكات ئەوە ڕاستگۆ نیـە لە خۆشەویسـتى بـۆ خواى گەورە، شـوێنكەوتنى پێغەمبـەرى خـوا صلى الله عليه وسلم بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستى خواى گەورەو هۆكارە بـۆ دەسـتخسـتنى خۆشەویســتى و لێخۆشــبوونى تاوانــەكان، وە خــواى گــەورە زۆر لێخۆشـبوو و بەڕەحم و بەزەییە، وە هەروەها دەبێ موسـوڵمانانى خـۆش بوێت و ڕقى لە بێ باوەڕان بێت، جا ئەوەى شەهادەت بێنێت و زانا بێ بە مـاناكەى و كاربـكات بەمەرجەكانى ئەوە بـۆتە موسـوڵمان، بەڵام ئەوەى شەهادەت بێنێ وە ماناكەى نەزانێت، یان شـەهادەت بێنێ و زانا بێ بەماناكەى بەڵام كارى پێ نەكات ئەوە نەبۆتە موسوڵمان.

واتا مەرجى قەبوڵ بوونى شەهادەت زانست و كاركردنە پێى.

## پایەی دووەم نوێژ کردنە:

الله سبحانه و تعالی پێنج نوێژی لەشەو و ڕۆژێکدا لەسەر هەموو موسوڵمانێکی بالغ فەرز کردووە و بەدەست نوێژەوە ئەنجامی دەدات.

جا نوێژەکان بریتین لە نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و چەند نوێژی تری سوننەت هەن وەک شەو نوێژ و نوێژی تەراویح و نوێژی چێشتەنگا و جگە لەمانەش.

بێگومان ئەنجامی دانی نوێژ جا فەرز بێت یاخود سوننەت ڕاستی باوەڕ دەردەخەن بۆیە خوای پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە پارێزگاری لێ بکەن و بەجەماعەت ئەنجامی بدەن ، هەروەک فەرموویەتی: (حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقوموا لله قانتين) البقرة/٢٣٨

واتە: پارێزگاری لەسەر نوێژەکانتان بکەن و بەردەوام بن لەسەری بەتایبەتی نوێژی ناوەڕاست کە نوێژی عەصرە.

سەرەتا لەناو نوێژدا قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ئیتر بێدەنگ بوون، واتە بەپێوە نوێژەکانتان ئەنجام بدەن لە نوێژی فەرزدا بەڵام سوننەت مرۆڤ ئەتوانێ بە دانیشتنیشەوە بیکات (قَانِتِينَ) واتە: گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن وە خشوعتان بۆ خوای گەورە هەبێ وە بێدەنگ بن و قسە مەکەن لەناو نوێژەکانتاندا

جا ئەم پێنج نوێژە لەشەو ورۆژێکدا ئەنجام دەدرێن وکات وساتی دیاری کراویان هەیە: (إن الصلاة كانت على المؤمنين كتاباً موقوتاً) النساء/ ١٠٣.

واتە: بە دڵنیایی نوێژ کردن فەرز کراوە لەسەر ئیمانداران وە کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە لە کەیەوە دەست پێ دەکات وە لەکەیدا کۆتایی دێت نابێ لەوە دوابخرێ ئیلا ئەگەر کەسێك عوزری هەبێ وەکو خەوتن یاخود لە بیرچوون ئەگەرنا لە کاتی نەخۆشی دا یان لەکاتی ترسیشدا لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنیشدا خوای گەورە ڕێگەی نەدا کە نوێژەکانیان دوابخەن وە بەجەماعەتیش فەرمانی پێ کردن کە بیکەن.

## پایەی سێیەم زەکات دانە:

بێگومان خوای گەورە مرۆڤەکانی بەجۆرەها شێوە و ڕەنگ دروست کـردووە بەشـێوەیەک هەنـدێک هەژار و هەنـدێک دەوڵەمەنـد بـۆ ئەوەی هەژار تاقی بکاتەوە تا چەند ئارام دەگرێت و دەوڵەمەندەکانیش تاچەند شوکر وسوپاسی خودا دەکەن.

وە لەبەر ئەوەی موسـوڵمانان بـران و بـرایەتیش بونیـاد نـراوە لەسـە ڕەحمەت و خۆشەویسـتی بـۆیە زەکاتی واجـب کـردووە و لە دەوڵەمەنـدەکان وەردەگیردرێـت ودەدرێـت بەهەژارەکان ، خـوای گەورە فەرموویەتی : (خذ من أموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بها وصلّ عليهم إن صلاتك سكن لهم) التوبة/١٠٣ .

واتە : ئەی محمد صلى الله عليه وسلم لە ماڵـەکانیان صـەدەقەو خێرێك وەربگرە یان زەکاتی فەرز وەربگـرە کـە بەهۆیـەوە پاکیـان ئەکەیتـەوە لەو تاوان و شـتانەی کـە پێیانەوەیە، وە دوعاشـیان بـۆ بکـە ئـەو دوعـای خێرو داوای لێخۆشبوونەی تۆ ئەبێتـە ڕەحمـەت و هێمنـی و ئـارامی و دڵنەوايي بۆ ئەوان، وە خوای گەورە زۆر بیسەرو زانا یە.

زەکات مـاڵ پـاک دەکاتەوە و بەرەکەتـداری دەکات ودەبێتـە هـۆکاری بەهێز کردنی خۆشەویستی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەکاندا.

وه خـوای گەوره زەکاتی واجـب کردووه لەسـەر کەسـێک ئەوەنـده ماڵی هەبێت بگاته ئەندازەی زەکات وساڵی بەسـەردا تێپەڕ بووبێت وەک زێڕ وزیو وشت و مەکی بازرگانی وبەرو بووم ودانەوێڵە ومەڕ وبـــزن و وشـــتر ومانگـــا که لەکتێـــبه فیقهیەکانـــدا بەدرێـــژی ڕوون کـــراوەتەوه، هەرکەســـێک زەکات دەر بـــکات خـــودا تاوانەکانی دەسڕێتەوه وپاداشتی گەورەی دەداتەوه: (وأقيموا الصلاة وأتـوا الـزكاة وما تقدموا لأنفسكم من خير تجدوه إن الله بما تعملون بصير) البقرة/١١٠.

واته : ئێوه نوێژەکانتان بکەن و ئـەنجامی بـدەن و ڕای بگـرن وه زەکاتی ماڵتـان بـدەن ، وه له دونیـادا هـەر کردەوەیـەکی چاك پێشـبخەن و بینێرن بۆ قیامەتی خۆتان ئـەوه له ڕۆژی قیامـەت لای خـوای گـەوره ئەجرو پاداشـتەکەی دەبیننەوه ، به دڵنیـایی خـوای گـەوره زۆر بینایـه بەهەموو کردەوەیەك که ئێوه ئەیکەن و هەمووی ئەبینێ.

دواتر بێگومان نەدانی زەکات دەبێته هۆکاری بەڵاو وموسیبەت وبڵاو بـوونەوەی خـراپه وناخـۆشی له وڵاتـدا جـگه له سزاو سـەختی دوا ڕۆژ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم - يوم يحمى عليها في نار جهنم فتكوى بها جباههم وجنوبهم وظهورهم هـذا مـا كـنزتم لأنفسـكم فذوقوا ما كنتم تكنزون ) التوبة /٣٤-٣٥.

واتە: وە ئەو کەسانەیشی۔ کە ئاڵتوون و زیو کۆ ئەکەنەوەو لە پێناو خوای گەورەدا نایبەخشن، واتە: زەکاتی ماڵەکەیان نادەن ئەوانە موژدەیان پێ بدە بە سزایەکی زۆر بەئێش و ئازار.

لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو زێڕو زیو و پارو خشڵەیان ئەهێنرێ لە ئاگری جەهەننەمدا بۆیان داخ ئەکرێ ، وە دەموچاو و لایەکان و پشتیانی پێ داخ ئەکرێ لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، وە پێیان ئەوترێ: ئا ئەمە ئەو کەنزو خشڵەیە کە ئێوە بۆ خۆتان هەڵتانگرتبوو زەکات و حەقی خوای گەورەتان لێ نەئەدا دەی بچێژن سزای ئەوەی کە هەڵتانگرتبوو، هاوەڵان فەرموویان چ ماڵ و سامانێکمان هەبێت؟ پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: (زمانێکی زیکرکار، وە دڵێکی سوپاسگوزار، وە خێزانێکی یارمەتیدەر لەسەر دینەکەتان)، (ئیبنو مەسعود) دەفەرمێت: (سوێند بە خوای گەورە دینار ناکەوێتە سەر دینارو درهەم ناکەوێتە سەر درهەم بەڵکو پێستەی ئەو کەسە فراوان دەکرێت و دینار دینارو درهەم درهەم پێی سزا دەدرێت)، (ئیمامی موعاویە) دەفەرموێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی کتاب دابەزی، (ئەبو زەڕ)یش دەفەرموێت: لەسەر ئەوان و ئێمەی موسڵمانیش دابەزی، کە (ئەبو زەڕ) باوەڕی وابوو هەرکەسێك لە پێویستی خۆی زیاتری هەبێت ئەوە کەنزەو ئەم

ئایەتـە دەیگرێتـەوە بۆیـە (ئـیمامی عوسـمان) ناردی بـۆ (رەبـەزە) کـە شوێنێکە نزیك مەدینە (خوا لە هەموویان رازی بێت).

وە دانی زەکات بەنهێنی خێری زیاترە لەوەی بەئاشکرا بدرێت خوای پەروەرگـار فەرمـوویەتی: (إن تبـدوا الصـدقات فنعمّـا هي وإن تخفوهـا وتؤتوها الفقراء فهو خير لكم ويكفر عنكم من سيئاتكم والله بما تعملـون خبير) البقرة / ٢٧١

واتە: ئەگەر صەدەقەو خێرتان کرد ئاشکرای بکەن ئەمە شتێکی چاکە بۆ ئەوەی خەڵکی چاوتان لێ بکات، بـەڵام دەبێـت ئاگـاتان لە نیـەتتان بێت و توشی ریا نەبن ، وە ئەگـەر هـاتوو بە نهێنی بیـدەن بەفـەقیرو هەژاران ئەمـەیان باشـترە بـۆ ئێـوە چونکـە پارێزراو دەبـن لە ریا و لە ساحەی مەحشەر لە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەدا دەبن، وە خوای گەورە لە خراپەکانتان خۆش ئەبێ بەهۆی ئەو صەدەقەیەی کـە کردووتانـە بـە نهێـنی و بـە ئاشـکرا، وە خـوای گـەورە زۆر زانیاریـەکی ووردی هەیە وە زانایە بە کردەوەکانی ئێوە.

پاشـــان پێویســـته زەکات تەنهـــا بـــدرێت بەو کەســـانەی کەخـــودا دەسنیشانی کردوون ، خوای پەروەرگار فەرموویەتی: ( إنما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم وفي الرقاب والغارمين و في ســـبيل الله وابـــن الســـبيل فريضـــة مـــن الله والله علـــيم حكيم ) التوبة/ ٦٠.

واتـه: خـوای گـەورە لێـرە مەسـاریفی زەکات باس ئـەکات زەکات بـۆ کێیـە؟ بۆ ئـەم هەشـت کۆمەڵەیـە کـە خـوای گـەورە دیاری کردووە یەکەمیان بـۆ فـەقیرە کەسـێك کـە هـیچ شـتێکی نیـەو داوا لە خـەڵکی ناکات، وە بـۆ (مسـکین)ە ئەوەیە کـە هەیـەتی بـەڵام بـەشی ناکات و دەگەڕێت و داوا لە خەڵکی دەکات ، وە بۆ ئەوانەیە کـە زەکاتەکـە کـۆ ئەکەنـەوە، کاتی خـۆی فەرمانبـەری دەوڵـەت هـەبووە زەکاتی کـۆ کردۆتەوە لەو زەکاتە بەشی خۆیشیان ئەدرێ ، وە بۆ ئەوانەی کـە تازە موسڵمان بوونە بۆ ئەوەی کە لەسەر ئیسلام دامەزراو بن، یاخـود بـۆ ئەوەی هاوشێوەکانیان موسڵمان بن، یاخود بـۆ ئـەوەی زەرەرو زیان لە دەوری موسڵمانان دوور بخرێتـەوە، یاخـود ئەیانـدەیتێ بـۆ ئـەوەی کـە موسڵمان بن، وەکو پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم لە غەنیمـەی حونەین ئەوەندەیدا بە (صـەفوانی کوڕی ئومەییـە) تا پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم بوو بە خۆشەویسـترین کـەس لەلای کـە پێشـتر

له هەموو کەس زیاتر رقی لێبوو وه بۆ ئەو کۆیله بۆ ئەوەی کە خۆیانی پێ بکڕنەوەو خۆیانی پێ ئازاد بکەن (یان ئازاد کردنی زیندانیه موسوڵمانەکان) ، وه بۆ کەسێك کە قەرزار بێت لە کاروبارێکی شەرعیدا، یاخود بەڵاو موسیبەتێکی بەسەردا هاتبێت و کەوتبێتە ژێر قەرزەوه ، وه بۆ موجاهیدان و جیهاد کردن لە پێناو خوای گەورەدا، وه حەج کردنیش دەگرێتەوه ، وه بۆ ڕێبواران کە له ماڵ و شاری خۆیان دوورکەوتونەتەوەو پارەیان لێبڕاوه ، بەم شێوازە خوای گەوره فەرزی کردووەو دابەشی کردووه ، وه خوای گەوره زۆر زاناو کاربەجێیه .

بەڵام ئەگەر هاتوو دوژمنانی خودا هێرشیان بۆ وڵاتی موسوڵمانان هێنابوو وه ئەگەر جیهاد (فرض العین) بوو، ئەوه پێویستە موسوڵمانان پارەی زەکات و صەدەقەکانیان بدەنە موجاهیدان چونکە فیتنەی کوفرو دەسەڵات گرتنە دەستی کافرەکان زۆر گەورەترە لە فیتنەی فەقیری و نەبونی.

## پایەی چوارەم ڕۆژوو گرتن:

ڕۆژوو کە ئەویش بریتی یە لەخۆگرتنەوە لەخواردن وخواردنەوە وجیماع کردن لەدوای بانگی بەیانیەوە تاوەکو بانگی مەغریب .

ئارام گرتن بۆ ئیمان وەک سەر وایە بۆ لاشە ، هەر بۆیەش خودا ڕۆژووی فەرز کردووە بەڵکو موسوڵمان فێری ئارام گرتن بێت وفێری بەخشین وگرتنەوەی ئارەزوو ببێت و بەبەزەیی بێت بەرانبەر هەژاران، خوای پەروەرگار فەرموویەتی: (یا أیها الذین آمنوا کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم لعلکم تتقون) البقرة/١٨٣

واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانتان لەسەر فەرز کراوە، هەروەکو چۆن لەسەر ئوممەتانی پێش ئێوەش فەرز کرابوو بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن.

خوای پەروەردگار ڕۆژووی لەسەر هەموو موسوڵمانێکی بالغی عاقڵ فەرز کردووە ، هەروەک فەرموویەتی: (شهر رمضان الذي أنزل فیه القرآن هدی للناس وبینات من الهدی والفرقان فمن شهد منکم الشهر فلیصمه , ومن کان مریضاً أو علی سفر فعدة من أیام آخر یرید الله بکم الیسر ولا یرید بکم العسر ولتکملوا العدة ولتکبروا الله علی ما هداکم ولعلکم تشکرون ) البقرة/١٨٥

واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی تیادا ناردە خوارەوە هەر هەمووی بەیەکجار لە (لوح المحفوظ)هوە بۆ (بیت العزة) لە ئاسمانی دونیا، یاخود وتراوە: یەکەم ئایەت لە مانگی ڕەمەزان دابەزیوە لە شەوی قەدردا ، ئەم قورئانە هیدایەتە بۆ هەموو خەڵکی ، وە ڕوونکەرەوەی ئەو هیدایەتەیە وە فورقانیش ئەوەی کە جیاکاری ئەکاتە نێوان حەق و باتڵ هەمووی ڕوونکراوەتەوەو درێژ کراوەتەوە ، هەر کەسێك لەو مانگەدا ئامادەبوو لە شاری خۆی بوو موقیم بوو ئەوا با بەڕۆژوو بێت، بەڵام کەسێك کە نەخۆش بوو یان لەسەفەردا بوو، ئەوە ئەتوانێ لە دوای ڕەمەزان لە چەند ڕۆژێکدا ڕۆژووەکانی بەقەزا بگێڕێتەوە، خوای گەورە ئاسانکاری بۆ ئێوە ئەوێ بۆیە ڕێگای بەنەخۆش و موسافیر داوە کە بەڕۆژوو نەبن، وە خوای گەورە نایەوێ شت لەسەر ئێوە قورس بکات، وە بۆ ئەوەی کە بەقەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژانە ماوەکەو مانگەکە تەواو بکەن، وە بۆ ئەوەی کە الله أكبر بکەن و خوای گەورە بە گەورە بزانن، وە کە ڕۆژوو تەواو ئەبێت و ئێوە ئەچن بۆ جەژن الله أكبر بکەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هیدایەتی داون ، وە بەڵکو شوکرانە بژێری خوای گەورە بکەن.

بێگومـان ڕۆژوو پاداشـتێکی، گەورەی هەیە پێغەمـبەر علیـه الصـلاة والسلام فەرموویەتی : (کل عمل ابن آدم يضاعف ، الحسـنة بعشر أمثالها ، إلى سبعمائة ضعف قال الله عز وجل إلا الصوم فإنه لي وأنا أجزي به ، يدع شهوته ، وطعامه من أجلي ) رواه مسلم , الصيام .

واتە : هەمـوو کردەوەیەکی نەوەی ئـادەم زیاد دەکرێـت ، هەر چاکەو یەک بە دەیە، تاوەکو یەک بەحەوت سەد خـوای گەورە فەرمـوویەتی تەنهـا ڕۆژوو نەبێـت کە بـۆ مـنە و خـۆم پاداشــتی دەدەمەوە ، واز لەئارەزووەکەی، خواردن دێنێت لەبەر من .

## پایەی پێنجەم حەج کردن:

خــوای گەورە قیــبلەیەکی بــۆ موســـوڵمانان داناوە بــۆ ئەوەی لەکاتی عیبادەتەکانــــدا ڕووی لـــێ بـــکەن کەئەویـــش لەشـــاری مەکەی پـیرۆزە: (فـول وجهـك شـطر المسجد الحرام وحيث مـا كنتم فولـوا وجوهكم شطره ) البقرة /١٤٤.

دەی ئێســتا ڕووتان وەرگێـڕن بـۆ کەعبـەی پـیرۆز، کـە لەناو نـوێژی عەصردا بوون ڕوویان وەرگێڕا بۆ کەعبـەی پـیرۆز، یاخـود دوو ڕکاتی نـوێژی نیـوەڕۆیان کـردووە ڕووەو قـودس پاشـان دوو ڕکاتەکـەی تـر ڕوویان لە قیبلە کردووە لە مزگەوتی بەنی سەلەمە بۆیـە پێـی دەوترێت مزگەوتی قیبلەتەین، بەڵام مزگەوتی (قوباء) لە ڕۆژی دواتـر هـەواڵیان پێ گەیشت لەناو نـوێژی بـەیانی بـوون ڕوویان وەرگێڕا بـۆ کەعبـەی پـیرۆز ، وە ئێـوەش ئـەی موسـڵمانان لە هـەر شـوێنێکدا بـوون ئیـتر لەنوێژ کردنتاندا ڕووبکەنە کەعبەی پیرۆز.

وە لەبەر ئەوەی وڵاتی موســـــوڵمانان دوورن لەیەکەوە وئیســـــلامیش بانـگەواز بـۆ یـەک بـوون ویەکـتر ناسـین دەکات لەسـەر خێـر وچـاکە ودەس باری یەکتر لەچاکەدا بـۆیە خـوای تەعالا حەجی فەرز کردووە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی بالغی عاقڵ کەتوانای هەبێت،

خـوای پەروەرگـار فەرمـوویەتی: (ولله عـلى النـاس حج البيـت مـن استطاع إليه سبيلا ومن كفر فإن الله غني عن العالمين) آل عمران /٩٧.
واتە: حەقی خـوای گەورەیە بەسـەر بەندەكانی كـە لە تەمندا جارێك حەجی ماڵی خـوای گـەورە بكـەن هـەر كەسێ تـوانای هـەبێ تـوانای لاشـەو جەسـتە و پـارە، وە ڕێگـا ئـەمن و ئاسـایش بێ ، وە هـەر كەسێك كە كوفر بكات واتـە: حـەج نـەكات و باوەڕی بـە حـەج نـەبێ ئەوا خوای گەورە بێپێویستەو دەوڵەمەندەو پێویسـتی بـە هـیچ كـەس نیە لە جیهان، بەم ئایەتە حەج فەرز بوو.

حەج وەرزێكە كە بانگەوازی موسوڵمانان تیایدا دەردەكەوێت و هێز و قـوەت ویەک بوونیـان تیایـدا بەدیار دەكەوێت بەوەی كەیەک خـودا دەپەرستن وشوێن یەک پێغەمبەر دەكەون وتەنانەت یەک جل لەبەر دەكەن.
جـا بێگومـان حەج چەنـد مەرج و ئـادابێكی هەیە كە واجبە لەسـەر موسوڵمان پەیـڕەوی بـكات وەک پاراسـتنی زمـان و گـوێ و چاو لەو شـتانەی كە حەڕامـن و یەكلا كـردنەوەی نـیەت بـۆ خـودا وخـۆ ڕازاندنەوە بەهەمـوو ئـاكار وئەخلاقێكی بەرز ودوور كەوتـنەوە لەهەر كارێكی خراپ ونەشیاو ودزێو،

خوای پەروەرگار فەرموویەتی: (الحج أشهر معلومات فمن فرض فيهن الحج فلا رفث ولا فسوق ولا جدال في الحج وما تفعلوا من خير يعلمه الله وتزودوا فإن خير الزاد التقوى واتقون يا أولي الألباب) البقرة /١٩٧.

واتە: کاتی حەج چەند مانگێکی دیاری کراوە کە (شەوال و ذو القعدة و ذو الحجة) یە، یاخود وتراوە: (شەوال و ذو القعدة و دەی ذو الحجة) یە ، جا هەر کەسێك ئیحرامی بەست ئەوە پێویستە لەسەری حەج بکات ، ئەوکاتە کە ئیحرامی بەست نابێ جیماع بکات و بچێتە لای خێزانی، یان قسەی خراپ لەگەڵ ئافرەتدا بکات وە نابێ لە سنووری شەرع دەرچێ بەوەی کە سەری بتاشێ یان هەر شتێکی تر بکات، یان زوڵم بکات یان قسەی ناشرین بکات، وە نابێ دەمەقاڵێ و مشتومڕ لەگەڵ خەڵکدا بکات لە کاتی حەجدا وەئێوە هەر خێرو چاکەیەك بکەن ئەوە خوای گەورە ئاگای لێیەو پاداشتتان دەداتەوە ، خەڵکی یەمەن حەجیان دەکردو خواردنیان لەگەڵ خۆیان ناهێناو ئەیانووت: ئێمە تەوەکول ئەکەینە سەر خوا، کە دەگەیشتنە مەککە داوایان لە خەڵکی دەکرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: زادیش لەگەڵ خۆتاندا بەرن بەڵام باشترین زادیش تەقوای خوای گەورەیە بۆ قیامەت،

وه زادی دونیاش خواردنەکەیە کە یارمەتیدەرتە لەسـەر تـەقوا ، ئـەی ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵن تەقوای مـن بکـەن و خـۆتان لە تاوان بپارێزن و بە تەنها لە من بترسێن.

وه حەج یەکـێکە لەو عیبـادەتانەی کە گەر موسـوڵمان وەک خـۆی ئەنجامی بدات وتەنها مەبەستی ڕەزامەندی خودا بێت لە ئەنجام دانی دا ئەوا لەهەمـوو تاوانەکان پـاک دەبێـتەوە پێغەمـبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من حج لله فلم يرفث ولم يفسـق رجع كيوم ولدتـه أمه) رواه البخاري برقم ١٥٢١٠ .

واتە: هەرکەسێک حەج بکات ودوور بێـت لە قسـەی پـڕ وپـووچ و کاری خراپ ئەوا دەگەڕێتەوە وەک ئەو ڕۆژەی کە لەدایک بووە .

بەڵام ئەگەر هـاتوو دوژمنـانی خـودا هێرشـیان بـۆ وڵاتی موسـوڵمانان هێنـابوو وە ئەگەر جیهـاد (فـرض العـين) بـوو، وەیان ئەگەر زەوی مەکـکە و مەدینـە بەدەسـت بێ باوەڕان بـوو ئەوە پێویسـتە لەسـەر موسـوڵمانان یارمەتی موجاهیـدان بـدەن و خـاکی موسـوڵمانان بـۆ موسوڵمانان بگەڕێننەوەو حوکم ببێتە حـوکمی ئیسـلام ئینجا بچن حەج بکەن چونکە فیتنەی کوفرو دەسـەڵات گـرتنە دەسـتی کافـرەکان زۆر گەورەیە، وەلەگەڵ ئەمەشـدا نـوێژ کردن دروسـت نیە لەدوای مەلاو پێشـنوێژێک کە لەیەکێک لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام تێ کەوتبێ،

وەک ئەو مەلایانەی کوفر بە تاغوت ناکەن، بەڵکو دۆستایەتی تاغوتەکان دەکەن، جا ئەگەر نوێژ کردن لە دوایانەوە دروست نەبێ ئەوە لە حەج یش هەرنابێ نوێژیان لەدواوە بکرێ.

خوای تعالی بمان پارێزێت لە هەڵەو تاوان و شارەزای شەریعەتەکەیمان بکات امین.

اللهم انصر دينك وكتابك وسنة نبيك يارب العالمين واكتب لنا الشهادة في سبيلك بعد طول عمر وحسن عمل إنك ولي ذلك والقادر عليه هذا وصلى اللهم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم